3

# چەند سەرنجێک لەسەر تەمەن

## گێراسکۆفیلیا - گەنجپەرستی - جیاکاری تەمەنەکان



عەلی ئەحمەد

# چەند سەرنجێک لەسەر تەمەن

عەلی ئەحمەد

_

بابەت : فیکری

٢٠٢٣

_

بەرگ : عبدالله سالح

_

# ناوەڕۆک

## دەروازە

ئەم پەڕتووکە بچووکە سەرنجمان دەخاتە سەر چەند پرسێکی گرینگی سەردەم سەبارەت بە تەمەن و ڕەهەندە گرینگەکانی.

پرسی تەمەنی مرۆڤ لە فەلسەفەی مۆدێرندا لایەنی جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت. وەکوو: سروشتی ژیانی مرۆڤ و مانای پیربوون و کاریگەرییە ئەخلاقییەکانی پیربوون و تەمەن بە گشتی.

یەکێک لە بۆچوونە دیارەکان لە فەلسەفەی مۆدێرندا، ئەو بیرۆکەیە کە ژیانی مرۆڤ بەها و مانایەکی سروشتی هەیە بەبێ گوێدان و ڕەچاوکردنی تەمەنێک. — ئەم ڕوانگەیە جەخت لەسەر گرینگیی کەرامەت و ڕێزگرتن لە هەموو

تاکەکان دەکاتەوە، بەبێ گوێدانە قۆناغی ژیانیان.

وە بۆچـوونێکی دیکـە ئەوەیـە کـە پـیربوون پرۆسـەیەکی سروشتییە کە پێویستە قبوڵ بکرێت. نەک لێی بترسێین یـان لێی دوور بکەوێنەوە. ئەم دیدگایـە جـەخت لەسـەر پێویستی گرنگیـدان بـە لایەنـە ئەرێنییـەکانی پـیربوون دەکاتـەوە، وەک کەڵەکەبوونی ئەزموونی ژیان و حیکمەت (دانایی).

وە لــە ڕووی ئەخلاقییــەوە، فەلســەفەی مــۆدێرن لەگــەڵ پرســـیارەکانی پەیوەســـت بـــە پـــیربوون و چـــاودێری تەندروستیشـــدا دەجـــەنگێت. بـــۆ نموونـــە: مشـــتومڕەکان ســـەبارەت بـــە بەشـــەخۆراکی چـــاودێری تەندروســـتی و چـــاودێری کۆتـــایی ژیانێـــک و ســـێکتەرەکانی چـــاودێری تەندرووسـتی بـە گشـتی. وە هـەروەها پرسـی پـیربوون و تەمـەن لـە فەلسـەفەدا تیشـک دەخەنـە سـەر تەحـەددیاتی

هاوسەنگکردنی سەربەخۆیی تاک و پابەندبوونە کۆمەڵایەتییەکانی لە چوارچێوەی دانیشتوانێکی بەساڵاچوو و فرەتەمەندا.

یەکێک لە پرسە گرینگەکانی ئەم کتێبە بریتییە لە تەمەنگەرایی. — تەمەنگەرایی بریتییە لە جیاکاری بەرامبەر بە مرۆڤەکان بە پشتبەستن بە تەمەنیان. وە ئەم پەتایە دەکرێت بە چەندین شێوە دەربکەوێت، وەکوو: گریمانەکان سەبارەت بەوەی کە کەسانی بەتەمەن کەمتر توانایان هەیە یان کەمتر بەرهەمدارن ... یان سەبارەت بە بێ ئەزموونی کەسانی گەنج ... — تەمەنگەرایی دەتوانێت زیانبەخش بێت هەم بۆ تاکەکان و هەم بۆ کۆمەڵگا بە گشتی. چونکە دەتوانێت دەرفەتەکان بۆ مرۆڤەکان سنووردار بکات بە پشتبەستن بە تەمەنیان نەک تواناکانیان یان تەنانەت بڕوانامەکانیشیان.

وە هـــەروەها پرســـی جیاکردنـــەوەی تەمـــەن بریتییـــە لـــە جیاکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ گروپ یان کۆمەڵگەی جیاواز بە پشتبەستن بە تەمەنیان. — دەکرێت ئەمە لە زۆر شوێن و جێگەی ڕەسمیش ڕوو بدات، وەکوو: قوتابخانە و شوێنی کار، یان دامەزراوە حوکومییەکان ... لە هەمان کاتیشدا جیاکردنـــەوەی تەمەنـــەکان هەنـــدێک جـــار دەکـــرێت هەڵبژاردنێکی بە ئەنقەست بێت لەلایەن ئەو تاکانەی کە دەیانەوێت لە دەوروبەری کەسانی دیکەی تەمەنی خۆیان بن، یاخود گەنجتر ... بەڵام هەروەکوو لە داهاتووی ئەم پەڕتووکەدا ئاماژەی پێ دەدەین، بێ-شک ئەم دیاردەیە کۆمەڵێک دەرئەنجامی نەرێنی و کۆمەڵێک عاداتی نەرێنی دەستەبەر دەخات و بە کۆمەڵگای دەفرۆشێتەوە.

بێ-شک هەردوو پرسی تەمەنگەرایی و کردەی جیاکردنەوە

لەسەر بەهای تەمەن، دەتوانن کاریگەری نەرێنی لەسەر تاک و کۆمەڵگا بچەسپێنن. — تەمەنگەرایی دەتوانێت ببێتە هۆی دابڕانی کۆمەڵایەتی و کەمبوونەوەی دەرفەتەکان و هەستکردن بە دابەزینی بەها. — وە جیاکردنەوەی تەمەن دەتوانێت بەشدار بێت لە تێنەگەیشتن و ئاڵۆزکردنی پەیوەندی نێوان گروپە جیاوازەکانی تەمەنەکان و دەتوانێت دەرفەتەکانی فێربوون و هاوکاری لە نێوان نەوەکاندا سنووردار بکات.

لەم پەڕتووکەدا هەوڵ دەدەین تیشک بخەینە سەر کۆمەڵێک خاڵ و کێشەی هاوپەیوەند لە پێناوی گەیشتن بە ئەنجام- گەلێک کە بتوانین لێیان تێبگەین و بیرکردنەوە و ئارگیۆمێنتی خۆمان لە پایاندا درووست بکەین.

بێگومان لەوانەیە نەمتوانیبێت بە تەواوەتی لەم پەڕتووکە

بچووکەدا ئامانجە پەیوەندیدارەکانی پرسەکە بپێکم ... — بەڵام بەوە خۆشحاڵم کە هەر هیچ نەبێت توانیومە سەرنجی خوێنەرانم بخەمە سەر پرسە گرینگ و چارەنووس- سازەکان.

پیری، تاجی ژیانە و دوا کردەی شانۆکەمانە.

- سیسێرۆ (Marcus Tullius Cicero)

## [پوختەی باس]

- لە ئێستادا چینی تەمەنەکان نامۆن لەگەڵ یەکتریدا.
- وە نەخۆشیی دەروونی گێراسکۆفیلیا بەربڵاوە.
- مرۆڤایەتی دووچاری نەخۆشیی دەروونی ئاڵوودەی گەنجییەتی بووەتەوە.
- تەمەنەکان لە یەکتری جیا دەکرێنەوە و لەگەڵ یەکتریدا بەشدار نین. ئەمەش دەرکەوتەی نەرێنی دەبێت.
- چینی تەمەنی گەنج لە ڕووی دەروونییەوە پەڕاوێز خراوە.
- چینی بەتەمەن هەوڵ نادەن بەها سەرەکییەکانی تەمەنەکەیان بخەنە گەڕ. وە چینی گەنجیش بە هەمان شێوە.
- چینی بەتەمەن چاویان لەسەر چینی گەنجە لە

ڕووی جوانییەوە نەوەکوو هاریکارییەوە.

- چینی گەنج چاوی لەسەر چینی بەتەمەن نییە چونکە باوەڕی بە زانین نییە.
- چیـنی بەتەمـەن پـەراوێز خـراوە چونکـە چیدیکـە بـەهایان بـۆ دانانـدرێت لەلایـەن چیـنی تەمەنـەکانی دیکەوە.

[١]

تەمەنـەکان زیـاتر لـە ڕابـردوو ڕۆچوونەتـە نـاو نەبوونـەوە. نـەک هـەر تـەنها هاوسـەنگی تەمەنـەکان نـەماوە. بـەڵکوو تەمەنەکان بە شـێوەیەکی ڕێکوپێک و ڕاستەقینەیی و دژە-ساختەیی؛ چیدیکـە کارەکانیـان بـەڕێ ناکـەن. بـەڵکوو هـەر تەمـەنێک ڕۆچووەتـە نـاو تەمـەنی خۆیـەوە. بەتایبـەتتر؛ چووەتەوە ناو تەمەنی هەرزەکارییەوە ... تەمەنـەکان بـوون بـە بلـق و لەیـەکتری جیـا کراونەتـەوە. — لـەم ڕوانگەیـەوە، هەوڵ دەدەم چەنـد سـەرنجێک لـە میانـەی تەمەنـەوە بخەمـە ڕوو و لە ڕوانگەیەکی فەلسەفی و مرۆڤناسیدا دۆخەکە لێـک بدەمەوە.



[٢]

گوتـەی بـاوی سـەردەم: وەرن بـا هـەموومان هـەرزەکار بینەوە. — لە ڕاستیدا، لێکدابڕانی تەمەنەکان لە ئێستادا زۆر زەقتر بووەتەوە. تەمەنـەکان خزمـەت بە یـەکتری ناکەنـەوە. بـەڵکوو تـەنها لـەناو سـووڕێکی خودکاریـدا پـەنگیان خواردووە. — سرووشتی مرۆڤایەتی، وە مرۆڤ بە گشـتی، ئاوایە کە دەبێت تەمەنەکان لەبەر یەکتری هـەبن. بـەڵام ئـەم

لەبەریەکتریبوونــە لــە ئــەنجامی پێویســتبوونی گیــانێکی هاوکارییــە لەنێوانیانــدا. وە ئــەوەی کــە پــێی دەگــوترێت بەتەمــەن دەبێت ئاگــای لــە تەمــەن بچووکــەکان بێت و پێچەوانەکەشی ڕاستە. — لێرەدا تەمەنـەکان لـە سـووڕێکی ئــەرێنی دان و لــە دوور و نزیکــەوە پەیوەنــدییان لەگــەڵ یەکتریدا هەیە. بەڵام ئەگەر هـەمووما گـەنج بین؛ ئـەوا هیچ ڕووداوێک نایەتە بوون کـە پابەنـد بێت بـە هـەر جۆرێـک لـە داڕێشتنی بنەمایەکی گۆڕانکاری لە ژیانێکدا.

[٣]

تەمەنــەکان بــە شــێوەیەکی خۆڕســکانە و لــە ئاســتێکی سرووشتیدا، هاریکاریی یەکتری دەکەن. ئەگـەرچی بەشـێکی زۆری تەمەنــەکان نائاگــان کــە لــە ڕاســتیدا بەرکەوتــەی بەردەوامیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە؛ بـەڵام خـودی پەیڕەوەکـە [سیســتەم] هــەر کــاری خــۆی دەکــات و پەیوەنــدی بــە

ئاستەکانی ئاگامەندی جڤاکێک و کۆمەڵە و تاکگەلێک نییە.
— چونکە خودی ئەم پەیڕەوە لەسەر بنەمایەکی <دەروونی-زیندەزانی/سایکۆ-بایۆلۆژی> چەقبەستوو و قووڵ دارێژرەوە کە لە ژێر دەستی مرۆڤدا نییە. — کۆمەڵگا جەستەیەکی زیندووە، چینی تەمەنەکانیش ، جەستەیەکی زیندوون و هەر ئەندامێکیان بەشێکی جەستە تەواوەکەیە. — تەمەن بوونەوەرێکی زیندووە و سەربەخۆیە.



[٤]

ڕێچکەکانی هاریکاریکردن لە تەمەندا بەم شێوازەن: مندال لە بەتەمەن فێر دەبێت. بەتەمەن لە گەنج فێر دەبێت. گەنج لە بەتەمەن فێر دەبێت. تەمەنەکان بەبەردەوامی لەناو سوورڕێکی بەرکەوتندان. وێنەکە ئاوایە:

مندال دەبێت خزمەت بکرێت لەلایەن گەنج و بەتەمەنەوە. — وە دووبارە گەنج و بەتەمەن دەبێت خزمەت بە یەکتری بکەنەوە.



منداڵ بوونەوەرێکە پێویستی بە هاوکاری هەیە. هاوکاری جەستەیی مەرجێکی پێویستییە لە تەمەنی منداڵیدا. بەڵام گەنج و ئەوەکانی دیکە، دەتوانن خۆیان جەستەی خۆیان بەڕێوە ببەن لە دۆخی مانەوەدا. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە، بریتییە لە ئاستی مەعریفی [ئێپیستیمۆلۆژی]ی تەمەنێک لە پای تەمەنێکی دیکەدا. هەر تەمەنێک خاوەنی ئاستێکی مەعریفی تایبەت بە خۆیەتی. — کە پێویستە خودی تاک ئاگامەند بێت پێی.

[٥]

کێشەی سەرەکی ئەوەیە تەمەن گەورەکان لە ئێستادا بەرکەوتەیەکی کەمیان لەگەڵ تەمەنی گەنجدا هەیە و، بەم شێوەیە تەمەنی گەنج هیچ زانینێکی بەهێزتر و پڕتر لە خۆی بەدەست ناهێنێت و تەمەنی گەنج ناچارە هەر لەناو تەمەنی گەنجەکاندا بمێنێتەوە کە تیایدا مەعریفەتگەلێکی

ناهۆشـــیارەکی و ئاســـتنزم ســـوورِ دەدەنـــەوە و تەمـــەن گەنجەکانیش بە ناچاری هەرسی دەکەن.

[٦]

لێرەدا دەمانەوێت پرسێک لـە پـای تەمەنـدا بورووژێنین. — ئایـە هـەرگیز لـەخۆمان پرسـیوە ئـاخۆ لەبـەرچی مامۆسـتا وەکـــوو پیشـــە بـــوونی هەیـــە؟ ... لـــە ڕاســـتیدا، بـــوونی مامۆســـتایەک دۆخێکی مێتافیزیکییـــە. — مامۆســـتایەکی بەرجەسـتەبووی مـاددی بـوونی نییـە. بـەڵکوو مامۆسـتاکان هەمیشـــە لـــە ئاســـتێکی مـــەعریفی و جەوهەریـــدان. — بەتەمەنەکان مامۆستاکانی کۆمەڵگان. — بـەڵام ئـەی ئەگـەر بەتەمەنەکان بوون بە قوتابی مامۆستا گەنجەکانی کۆمـەڵگا؟

... لێرەدا دوو سەرنج دێنە گۆڕێ:

١. یـان ئـەوەتا دەبێت تەمـەن گەنجـەکان ئەوەنـدە لێهـاتوو و پڕزانین بن، کە بتـوانن ئاسـتی بەتەمەنـەکانیش تێپـەڕ بکـەن.

[که له ئێستادا وا نییه، هەر وەکوو زۆربەی سەردەمەکان و، ڕەنگە یاسایەکی گشتی ژیانیش بێت و لە داهاتووشدا ئەگەرێک نییە ئەم یاسایە بگۆڕێت]

٢. یان ئەوەتا بەتەمەنەکان و گەنجەکان دەستیان هەڵگرتووە لە دۆخی تەمەنەکانیان و جڵەویان کردووە بۆ خۆخواردنەوە و مشەخۆرکردنی کەلتوورەکانی نێو خودی تەمەنەکان.

[٧]

لەناو پرسی تەمەنەکاندا، ئێمە ڕەتکەرەوەی تەمەنەکانی خۆمانین: تەمەن گەنجەکان دەڵێن پیرین و تەمەنمان ڕۆیشت. تەمەن پیرەکان دەڵێن گەنجین و دڵمان تەڕە. ئەم دوو هێزە کارلێککردنێکی دژە-مەعریفی پێک دەهێنن. — چونکە هەر چینێک لە تەمەنەکان، تەمەنەکەی خۆی ڕەت دەکاتەوە و نایەوێت ئەم بێت. — لە ڕاستیدا، ئەم کێشەیە

هـەر لـە سـەرەتاوە پەیوەنـدی بـە تەمـەنی گـەنجی و پـیری نـەبووە. بـەڵکوو لـە سـەرەتاوە، لـە سـەردەمی منداڵییـەوە دەسـتی پـێ کـردووە. — کاتێـک کـە گـوترا: گـەورە بـوویت حـەز دەکـەیت یـاخود دەتـەوێت ببیت بـە چی؟ ... زۆربـەی وەڵامەکان بریتی بوون لە مامۆستا و دکتـۆر و تەلارسـاز و پـۆلیس و چەنـدین بابـەتی دیکـەی هەمـەجۆر ... — بـەڵام پرسە سـەرەکییەکە هـەرگیز لەسـەر ئـەوە نـەبووە کـە ئـاخۆ من لـە ئێسـتادا چی بکـەم. لـە تەمـەنی منداڵیـدا چی بکـەم و چۆن ئەم تەمەنە بە باشترین شێوە بەسەر ببەم. — نـەخێر ئاوا نەبووە. بەڵکوو هەموو سـەرنجەکە لەسـەر گـەورەبوون بووە. ئێمە منداڵەکانمان بە وەهمی گەورەبوون دەشـۆیینەوە و دواجاریش هیچ بیرێک لە ئێستاییبوونی خۆیـان ناکەنـەوە. چونکە ئەوان هەمیشە بیریان لەلای ئەوەیـە کـە ببن بـە چی. ئەو بوون بە تشـتەی کـە ئەگەریشـی نییـە بـەرپا بێت ... — دواجـــار ئەمـــە هۆکـــاری ئامـــادەکردنی منداڵەکانـــە بـــۆ

خزمـــەتکردن بـــە کۆمـــەڵگا. بـــەڵام ئەمـــە لـــە ڕوانگـــەی بەتەمەنەکان و تەمەن گەنجەکانەوەیە کـە دەبێت منـداڵ ئـاوا بیر بکاتـەوە. بـەڵام دەشـێت ڕێگـەچارەی دیکـە هـەبێت وەک لـەوەی کـە لـە ڕابـردوودا باسـی لێوە کـراوە و بووەتـە بـە مانشێتێکی نێو پۆل و کۆبوونەوە کۆمەڵایەتییەکان ...

[٩]

پـــیری بـــاڵا: پـــیربوون تەمەنێکـــە تیایـــدا تاکێـــک پێویســـتە هەڵبسـتێت بـە ڕێکخسـتن و ئامۆژگـاریکردنی خواروەکـانی خـــۆی. ئامۆژگـــاریکردنی ئەوانـــەی کـــە ئـــەو ئەزموونـــەیان نەبووە. تەمەنەکان خاوەنی چەنـدین چین و پێگـەن. وە هـەر چین و پێگەیـەکیش خەسـڵەت و تایبەتمەنـدی خـۆی هەیـە. بەشێکی هـەرەزۆری تاکـەکانی کۆمـەڵگا لـە ئێسـتادا، هـەوڵی دەربـازبوون لـە پـیری دەدەن. چونکـە پـیری لـەلای ئـەوان مەترسـییەکی جەسـتەیی و دەروونی هەیـە [بەتایبـەتتر بـۆ

کۆتاکێـک کـە تـەواوی ژیـانی تـەنها بـیری لـە جەسـتەکەی کردووەتــەوە ...] بــەڵام ســەیر ئەوەیــە بــیر ناکەنــەوە کــە پــیریش خــاوەنی تایبەتمەنـدی خۆیــەتی. — مــرۆڤی پــیر خـاوەنی ئـەرک و بەرپرسـیاریەتی خۆیـەتی و، وەکـوو هـەر تەمــەنێکی دیکــە گرینگــە و پێویســتە. دەبێت هۆشــیارییەک بــەرپا ببێتــەوە لــەناو کۆمــەڵگادا کــە بگەڕێینــەوە بــۆ لای پیرەکان. چونکە ئەوان هەمیشە ئـەزموونیان زیـاتر بـووە لـە ئێمە. ئەگەرچی هەندێک تشت و کرداریشیان نەکردبێت، خـۆ گوێیان لێ بـووە و بینیویانـە. — کـەواتا؛ ئەمـەش دەبێت بـە ئـەزموونێک بۆیـان و لـە کاتێکدا تەمـەن گەنجـەکان سـەری خۆیان دەهـاڕن لەبـەر بابـەتێکی سـادە و کـەم، ئـەوا لـە لای بەتەمەنــەکان ئــەم بابەتــە هــەر بــەهای بــۆ دانانــدرێت و چارەسەرەکەشـیان لەلایـە. وە هەمیشــەش پرسـە سـادەکان لەلای گەنجـەکان بـەقووڵ دەزانـدرێت و لـەلای بەتەمەنـەکان بەپێچەوانەوەیە. واتا ساکارە ...

لــە ڕابــردوودا بەشــیکی زۆری لــە فەیلەســووفان پرســی تەمــەنیان ورووژاندوە. بۆنموونــە: ســیمۆن دێ بۆڤــوار لــە پەڕتووکی <تەمــەنی پیر>/<هــاتنی تەمــەن>دا ئــەم پرســەی ورووژدانــدووە لــێرەدا هەنــدێک وتــەی نــاو پەڕتووکەکــە دادەنێینەوە وەک بەرچاوڕوونییەک [١] :



"پیری نەخۆشی نییە: بەڵکوو هێز و مانەوە و سەرکەوتنە بەسەر هەموو جۆرە گۆڕانکاری و نائومێدییەک و تاقیکردنەوە و نەخۆشییەکدا". [٢]

"پارادۆکسی (مەتەڵ) پیری ئەوەیە کە عەقڵ بە گەنجی و زیندوو دەمێنێتەوە لە کاتێکدا جەستە وردە وردە تێک دەچێت. زۆرجار پیر لە جەستەیەکدا گیری خواردووە کە چیتر گوێڕایەڵی ئەو ناکات، کە جوڵەکانی سنووردار دەکات و کارەکانی قورس دەکات. بەڵام عەقڵ بە وریایی دەمێنێتەوە، دۆخێکی سەیر و هەندێکجار سەختە. کە لە ڕووی دەروونییەوە چالاک بیت بەڵام لە ڕووی جەستەییەوە لاواز بیت." [٣]

"یەکێک لە تەحەدا گەورەکانی تەمەنی پیری بریتییە لە بەرەنگاربوونەوەی وەسوەسەی کشانەوە لە دونیا، خۆ

داخستن لە ژاوەژاو و سەرلێشێواوی ژیانی ڕۆژانە.

دەکـــریێ ئەمـــە وەڵامێکی سروشـــتی بێت بـــۆ لاوازبـــوونی جەستەیی، بەڵام وەڵامێکی تەندروست نییـە و گرنگـە لەگـەڵ جیهانـــدا بـــە ســـەرقاڵی بمێنیتـــەوە و بـــەردەوام بین لـــە بـــەدواداچوونی بەرژەوەنـــدی و خولیاکـــان و پاراســـتنی پەیوەندییـــــــــــــــە کۆمەڵایەتییـــــــــــــــەکانمان". [٤]

"پیری دەتـوانێت کـاتێکی تێڕامانگـەراش بێت، وە کاتێـک بێت بۆ ئاوڕدانەوە لە ژیانی مـرۆڤ. بـەڵام هاوکـات کاتێکـە لـەبۆ ئاوڕدانـــەوە لـــە پێشـــەوە، بـــۆ وەرگرتـــنی ئـــەزموون و تەحـــەددیاتی نـــوێ و بـــەردەوامبوون لـــە فـــێربوون و گەشەکردن. وە هەرگیز تەمەن درەنگ نییە بۆ دەستپێکردنی پڕۆژەیەکی نوێ، بۆ فێربوونی کارامەییـەکی نـوێ، یـان بـۆ دۆزینـــــــــــەوەی هـــــــــــاوڕێی نـــــــــــوێ". [٥]

"یەکێک لە گرنگترین ئەو کارانەی کە دەتوانین بۆ خۆمان بیکەین لەگەڵ بەرزبوونەوەی تەمەنمان، پاراستنی هەستکردنە بە ئامانج و مانا لە ژیانماندا.

ئەمەش دەتوانێت چەندین شێوەی هەبێت، لە کاری خۆبەخشی و خزمەتکردنی کۆمەڵگاوە ... تا بەدواداچوون بۆ هەوڵی داهێنەرانە یان تەنها بەسەربردنی کات لەگەڵ کەسە نزیکەکان". هەرچییەک هەستی بەدیهاتن و ڕەزامەندیمان پێ دەبەخشێت، پێویستە هەوڵ بدەین لەگەڵ گەورەبوونمان بەردەوام بین لە ئەنجامدانی." [٦]

هەروەک دەبینین، سیمۆن دێ بۆڤوار گرینگییەکی زۆر بە چینی بەتەمەن دەدات و پێی وایە کە دەبێت ئەم چینە و ئەم دۆخە بە گرینگ بزاندرێت لە ژیانێکدا. — نەوەکوو ڕەت

بکرێتەوە و بە ڤیزەونی ڕەچاو بکرێت.

یەکێک لە تەوەرە سەرەکییەکانی پەڕتووکەکەی سیمۆن دێ بۆڤوار، ئەو بیرۆکەیە کە پیری زۆرجار وەک جۆرێک لە دابەزین و لاوازی سەیر دەکرێت، چی لە ڕووی جەستەیی و چی لە ڕووی دەروونییەوە ... سیمۆن دەیەوێت ڕەخنە لەم بۆچوونە بگرێت.

دی بۆڤوار دەڵێت ئەم بۆچوونە بە قووڵی کەموکوڕی تێدایە و شکست دەهێنێت لە لەبەرچاوگرتنی ئەو ئەزموونە زۆر ئاڵۆز و جۆراوجۆرانەی کە دۆخی پیربوونێک دەستەبەری دەکەن ...

دی بۆڤوار دان بەوەدا دەنێت کە بە دڵنیاییەوە گۆڕانکاری جەستەیی و دەروونی هەیە و لەگەڵ تەمەندا دێن. بەڵام

سیمۆن ئەو تێڕوانینە ڕەت دەکاتەوە کە ئەم گۆڕانکاریانە لاوازی و دابەزینێک بن.

بەڵکوو دەڵێت پیری دەتوانێت کاتێک بێت بۆ گەشەکردن و، پەیوەستبوونێکی قووڵ بێت بە خودی ناخی تاکێکەوە..

چونکە تاکەکان ڕووبەڕووی مردنی خۆیان دەبنەوە و بیر لە مانای ژیانیان دەکەنەوە. وە هەروەها سیمۆن جەخت لەسەر گرنگی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە لە دارشتنی ئەزموونی پیربوون، — ئاماژە بەوە دەکات کە شێوازی هەستکردن و مامەڵەکردنی پیری لەلایەن کۆمەڵگاوە دەکرێت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئەزموونە تاکەکەسییەکانی پیربوون هەبێت و لێرەدا سیمۆن، بەها باوەکانی کۆمەڵگا سەبارەت بە دۆخی پیری بە گرینگ دەرەخسێنێت و پێی وایە کە دەبێت کۆمەڵگا بە

گۆشە-نیگایەکی دیکە ڕەچاوی دۆخی پیربوون بکات.

یەکێک لە ئاستەنگە سەرەکییەکانی بەردەم گەورەساڵانی بەتەمەن، بە گوتەی دی بۆڤوار، ململانێیە بۆ پاراستنی هەستی سەربەخۆیی و هەستی بوون-بە-خۆیان لە کۆمەڵگایەکدا کە زۆرجار وەک بێدەسەڵات و وابەستە مامەڵەیان لەگەڵ دەکات.

ئەو دەڵێت زۆرجار گەورەساڵان پەراوێز دەخرێن و لە زۆر لایەنی ژیانی کۆمەڵایەتی دوور دەخرێنەوە و ئەمەش دەبێتە هۆی هەستکردن بە بێدەسەڵاتی و بێزاری.

لە هەمان کاتیشدا، سیمۆن جەخت لەسەر گرنگی بەرەنگاربوونەوەی ئەم چەشنە چەقبەستووانە دەکاتەوە و جەخت دەکاتەوە لەسەر سەربەخۆیی و ڕێزگرتن لە

بەساڵداچووەکان و چینی نا-گەنجەکان.

ئەم پەڕتووکەی سیمۆن دیٚ بۆڤوار تێزێکی بەهێز پێشکەش دەکات لە شێوازی هەستکردن و مامەڵەکردنی پیری لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا.

دی بۆڤوار لە ڕێگەی شیکارییەکانییەوە سەرنجی خەڵک ڕادەکێشێت بۆ چەندین ئەزموونی ئاڵۆز و جۆراوجۆری پیربوون، و بانگەشە بۆ ڕوانگەیەکی چاکتر و بەزەییدارتر دەکات بۆ ئەم قۆناغە گرنگەی ژیان. [٧]

[١٠]

باسیکی دیکە لەسەر پرسی تەمەن، تێکەڵ-نەبوونی گەنج و بەتەمەنەکانە. ئایە لەبەرچی تێکەڵ-نەبوونی بەتەمەن و گەنج مەترسیدارە؟ ... کاتێک تەمەن گەنجەکان بۆ

ماوەیـەکی زۆر لـەناو خۆیانـدا دەمێننـەوە، هەڵدەسـتن بـە پێکهێنانی کۆمـەڵێک کـەلتوور و هەقایـەتی عەنتیکـە و سـەیر. — هەتا وای لێ دێت باوەڕ بە هیقایەتـە درووسـتکراوەکانی خۆشـیان دەکـەن. ئەگـەرچی گـەنج پلەیـەک لەپێشـترە لـە بەتەمەن لەوەی کە ئەوان چەقبەسـتوو نین لەسـەر ڕابـردوو و ئامادەی گۆڕانکارین ... بەڵام تەمەن گەنجەکان لە هـەمان کاتدا چەقبەستوون لەناو کەلتووره گەنجانەکەی خۆیـان. — کـە کۆمـەڵێک دەرکەوتـەی هونـەری و ئـەدەبی درووسـت دەکات و پاشـانیش هـەمان دەرکەوتـەی هونـەری و ئـەدەبی دەبنەوە نموونەیـەک بـۆ تەمـەن گەنجـەکان. — ئـەم دابڕانـە نەرێنییـە بـۆ بەتەمەنـەکانیش دەشـێت وا بێت: کاتێـک بەتەمەنەکان بۆ ماوەیەکی زۆر هەر لەگەڵ خۆیاندان، ئـەوان تەنها باس و زانین لەسەر ئـەو پرسـانە دەورووژێنن کـە لـە ڕابردوودا هەبووە و وایـان زانیـوە ... نـەوەکوو ئـەوە بـووە کە دەبێت ببێت یان ئـەوە بـووە کـە خـۆی لـە ڕاسـتیدا وەهـا

خۆی نیشـان داوە. — بـەم شـێوەیە بەتەمەنـەکانیش دەچنـە نـاو دۆخێکی قەتیسـکراو و دابـڕاو لـە تەمەنـەکانی دیکـەدا. کەواتا؛ قەتیسبوون و دابڕاندنی تەمەنی گەنج و پیر، وەکـوو درووسـتکردنی دیـوارێکی بـەرز وایـە لـەنێوان دوو جیهانـدا. — وە بەریەکنەکـەوتنی ئـەم دوو جیهانــە، هیچ زانینێـک و مەعریفەیـەک بەرجەسـتە ناکـات. لەبـەر ئـەوە، پێویسـتە ئـەم دوو جیهانــە ئاشــنای یــەکتری ببن. وە زانین و مەعریفــەت ئاڵوگۆڕ بکەن.

## [١١]

ڕەخنەیــەک لــەپای <گــەنج لەگــەڵ گەنجـدا بــوون> : ئایــە تەندرووسـتە گەنجـەکان لەگـەڵ گەنجەکانـدا بن؟ ... ئەگـەر سەرەتا چاوێک لە بابەتەکە بخشـێنین، مەترسـییەکی وەهـای لێ بــەدی ناکــەین. بــەڵام دوای لێکۆڵینــەوەی وردمــان لــەم بارەیــەوە، ئــەوا دەبیـنین تەمــەنی گــەنج و هاوتەمەنــەکانی،

ئامانجێــک نین و هیچ زانیــنێکیش دەســتەبەر ناکــەن. —
پرسـیارەکە ئەمەیـە: ئـاخۆ لـە ئێسـتادا گـەنج چی بـۆ گـەنج
هەیـە؟ ... ئایـە گـەنج تشـتێکی بـۆ گـەنج هەیـە؟ ... هەڵبەتـە
لێرەدا ئێمە گشـتگیرییەکی نـالۆژیکی گـەورە ئـەنجام دەدەین
ئەگەر هەموو گەنجێک بخەینە ناو یـەک قاڵبـەوە. بـەڵام ئێمـە
مەبەسـتمان لـە ڕێـژەی زۆری گەنجەکانـە. ئـەم ڕێـژە زۆرە،
بەشێکی زۆریان هەر تەنها لەناو خۆیاندا دەمێننەوە. وە ئایە
هاوڕێکانیـان کێن؟ ... هــەر گـەنجن. چونکـە ئـەوان لەگـەڵ
بەتەمەنەکانـــــدا دانانیشـــــن. — ئایـــــە مامۆســـــتا و
زانیاریوەرگرەکانیـــان کێن؟ ... هـــەر گـــەنجن. وەکـــوو
هونەرمەند و شاعیر و چەندین پێگەی کۆمەڵایەتی دیکە. —
کێشــەکە ئەوەیـە کـە ئـەم تەمەنـە گەنجانـە هیچ زانیـنێکی
یەکلاکەرەوە و پەتی دەسـتەبەر ناکـەن لـە پـای کێشـەکان و
پرسـە چـارەنووس-سـازەکانی ژیانـدا. وە چەنـدین گوتـار و
وەهادانـانی ناڕیـک دەخــەملێنن و نـاوی لێ دەنێن: پەنـد و

ئامۆژگاری و وتە و قسـەی بـەقوەت و بـەهێز [هـەر وەکوو ئەو ئیدیت و ڤیدیۆیانەی کە لە تۆڕی کۆمەڵایەتی تیکتـۆک و ئینسـتاگرام بـەرچاو دەکـەون ... ]. بـەڵام لـە ڕاسـتیدا واش نییـە و، ئـەم هەڵسـەنگاندنانە هـەر تـەنها لـە ئاسـتی تەمـەنی گەنجییەتیدا دەمێننەوە و بڵند نابنەوە بۆ ئاسـتی تەمەنـەکانی دیکە.

[١٢]

گێراسـکۆفیلیاکانی نـاو تەمـەن: گێراسـکۆفۆبیا [ Gerascophobia] بریتییـە لـە ترسـی پـیربوون و بەتەمـەنبوون. [٨] لـە ئێسـتادا مرۆڤایـەتی دووچـاری ئـەم ترسـە بووەتـەوە. تەنانـەت هـەر لـە تەمـەنی گەنجەکانیشـدا ئەمـە ڕەنگی داوەتـەوە. چونکـە لـە ڕاسـتیدا پلەوپایـەکانی تەمەن بوونیان نەماوە. — تەمەن لە سرووشـتدا پەیوەسـتە بە کۆمەڵێک پێکهاتەی بنەڕەتییەوە. بۆنموونە: تەمەنی گـەنج،

فێربوونـــه. تەمـــەنی پـــیر، فێرکردنـــە. هەڵبەتـــە ئەمـــە گشـــتگیریکردنێکی ســـادەیە، بـــەڵام ئـــەم پلەبەندییـــە کـــاڵ بووەتەوە و مانای خۆی لەدەست داوە.



لــە کاتێکــدا ئاســاییە هەنــدێک نیگــەرانی بــوونی هــەبێت سەبارەت بە پیربوون، بەڵام کاتێک ئەم ترسانە زیـادەڕەوی تێـدا دەکـرێت: دەکـرێن زیانبـەخش بن. ئێســتا ئێمــە لــەم دۆخەداین.

لێرەدا دەمەوێت هەندێک لە مەترسییەکان و چارەسەرەکانی گێراسکۆفۆبیا ئاشنای خوێنەر بکەم:

**مەترسییە سەرەکییەکان:**

**زیادبوونی دڵەڕاوکێ و قەلەقی**: گێڕاسکۆفۆبیا دەبێتە هۆی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی بەردەوام سەبارەت بە پیربوونی تەمەنێک. ئەمەش دەبێتە هۆی بەرپابوونی فشارێکی بەرچاو و کاریگەریی نەرێنی لەسەر تەندرووستی دەروونی تاکێک.

**دابڕانی کۆمەڵایەتی**: ترس لە پیربوون دەبێتە هۆی ئەوەی تاکەکان لە کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان بکشێنەوە و چالاکییەکانیان سنووردار بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی هەستکردن بە تەنیایی و گۆشەگیری (بەتایبەتتر لەگەڵ

بەتەمەن و پیرەکاندا).

**خـــەمۆکی**: گێڕاســـکۆفۆبیا دەبێتـــە هـــۆی هەســـتکردن بـــە بێهیـــوایی و خـــەمۆکی، ئەمـــەش وا دەکـــات ئـــەم تاکانـــە پێویســـتییان بـــە یارمـــەتی پســـپۆڕەکان و کەســـانی شـــارەزا ببێت.

**ڕەفتاری وەسوەسەیی**: ئەو تاکانـەی تووشـی گێڕاسـکۆفۆبیا بـوون، وەسوەسـەکی لەڕادەبـەدەریان بۆ پاراسـتنی گـەنجی یان ڕوخساریان هەیە. کە ئەمەش دەبێتـە هـۆی دەرکـەوتنی ڕەفتاری ناتەندروست لە تاکێکدا بۆ چارەسـەرکردنی: وەک ڕێجیمکردنی لەڕادەبـەدەر یـان زیـادەڕۆیی لـە وەرزشـکردن و، تەنانـــەت نەشـــتەرگەری زیانبەخشـــیش لـــە پێنـــاوی هێشتنەوەی گەنجیەتیدا.

گیراسکۆفۆبیا دەبێتە هۆی بەکارهێنانی **میکانیزمی ناتەندروست بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ترسی پیربوون**، ڕەنگە هەندێک لە تاکەکان ڕوو لە <میکانیزمی ڕووبەڕووبوونەوەی ناتەندروست> بکەن وەک بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و نەشتەرگەری ناپێویست. کە دەبێتە هۆی ئالوودەبوون و کێشەی تەندروستی دیکە.

وە هەروەها خاڵێکی نەرێنی دیکە بریتییە لە **کەمبوونەوەی کوالێتی ژیان**: گێڕاسکۆفۆبیا کاریگەری لەسەر کوالێتی ژیانی تاکەکان هەیە. ئەمیش بە هۆی سنووردارکردنی چالاکییەکان و پەیوەندییەکانی ژیانی تاکێکەوە دەبێت. —— کە ئەمەش دەبێتە هۆی هەستکردن بە ناڕازیبوون و ڕق لێبوونەوە لە ژیان.

**کێشـەی تەندروسـتی:** فشـار و دڵـەڕاوکێی پەیوەسـت بـە گێڕاسـکۆفۆبیاش دەتـوانێت کاریگـەریی جەسـتەیی لەسـەر تـاک هـەبێت، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی دروسـتبوونی کێشـەی تەندروستی وەک بەرزی پەسـتانی خـوێن و نەخۆشـییەکانی دڵ و لاوازبوونی سیستەمی بەرگری لەش ...

***

کۆمەڵگا مۆدێرنەکان بەدەست ئەم دیاردەیەوە دەناڵێنن. — ئەگەرچی بۆ مرۆڤی مۆدێرن زاڵبوون بەسەر گێڕاسکۆفۆبیا ڕەنگـە سـەخت بێت ... — بـەڵام بـە سـتراتیژیەک و پلانـدانانێکی درووسـت، دەتوانـدرێت تاکێـک بەسـەر ئـەم ترسـانەدا زاڵ ببێت. لـێرەدا چەنـد خاڵێـک [ئامۆژگارییـەک] دەخەینە ڕوو کە یارمەتی تاکێک دەدەن بۆ چارەسـەرکردنی

گێڕاسکۆفۆبیا:

**بەکردارکردن و بەعەمەلیکردنی ئارامبوون**: ئارامگرتن و سەبرگرتن، کایەکی گرینگی ژیانە. پراکتیزەکردنی ئارامبوون، وەکوو: تێڕامانێکی خودی یان هەناسەدانی قووڵ، دەتوانێت یارمەتی تاکێک بدات لە هەستی دڵەڕاوکێی ڕزگاری ببێت و توانای ئامادەبوونی لە ئێستادا زیاتر بێت. نەوەکوو سەرنجی لەسەر قەلەقی و ترسەکانی داهاتووی بێت.

**تەحەداکردنی بیرکردنەوە نەرێنییەکان**: بیرکردنەوە و بیروباوەڕی نەرێنی سەبارەت بە پیربوون دەتوانێت وەکوو سووتەمەنی بێت بۆ فۆبیای تەمەنێک. وە دەکرێت یارمەتیدەر بێت کە تەحەددای ئەم بیرکردنەوانە بکرێت و لە شوێنی ئەوان بیرکردنەوەی ئەرێنیتر و ڕاستەقینەتر

دابندرێت.

**فێربوون دەربارەی پیربوون**: فـێربوونی کێشـەیەک هەمیشـە وا دەکات ترسمان کەمتر ببێتەوە سەبارەت بە کێشـەکە. — کـەواتا، فـێربوون دەربـارەی پرۆســەی پـیربوون و ئـەو سوودە زۆرانـەی کـە لەگـەڵ تەمەنـدا دێت، وەک حیکمـەت و ئـەزموونی ژیـان، دەتـوانێت یارمەتیـدەر بێت بـۆ گۆڕیـنی دیـدگای تاکێـک و کەمکردنـەوەی ترسـەکانی. — جگـە لەوەش، فـێربوون دەربـارەی هـەر ترسـێک دەبێتـە هۆکـاری کەمبوونەوەی ترسەکەمان لێی.

**بە چالاکی مانـەوە**: بەشـداریکردن لـە چالاکییـە جەسـتەیی و کۆمەڵایەتییـەکان یارمـەتی کەمکردنـەوەی فشـاری دەروونی و باشترکردنی تەندروستی تاکێک دەدەن. وە هەستکردن بە کۆنترۆڵکردنی جەستە و دەروونیش بە تاک دەبەخشنەوە.

**داوای یارمەتی لە کەسانی شارەزاتر و پسپۆڕتر لە خۆت بکە**: گێڕاسکۆفۆبیا دەکرێت ببێت بە پرسێکی وێرانکەر لە ژیانی تاکێکدا. — لەبەر ئەوە، داوای یارمەتی پیشەیی و پسپۆڕی لە چارەسەرکار و دکتۆر، یان ڕاوێژکاری نەخۆشییەکان بکە. — ئەم ئەزموونە دەکرێت یارمەتیدەر بێت. چونکە کەسانی شارەزاتر لە خۆمان دەتوانن پشتگیری و ڕێنمایی واقیعی و تەندرووست بە ئێمە ببەخشن. وە هەروەها هیچ عەیبێک و ناشیرنییەک لە ویستنی هاریکاریدا نییە.

**درووستکردنی سیستەمێکی پشتگیری**: دروستکردنی سیستەمێکی پشتگیری خێزان، هاوڕێیان، یان هاوتەمەنەکان کە هاوبەشی نیگەرانییەکانی تۆن سەبارەت بە پیربوون. — ئەمەش دەتوانێت هەستێکی کۆمەڵایەتیت بۆ دابین بکات و

یارمەتیت بدات کەمتر هەست بە گۆشەگیری بکەیت. (بۆ ئەم بابەتە پێویستە تاکی تووشبوو گفتوگۆ لەگەڵ لە خۆی شارەزاتر بکات).

**قبووڵکردنی پیربوون**: لە ئامێزگرتن و قبووڵکردنی پرۆسەی پیربوون و نەک بەرەنگاربوونەوەی ... — دەتوانێت یارمەتی تاکێک بدات بۆ دۆزینەوەی ئارامی و خۆشی لە ساتەوەختی ئێستادا. وە تاک دەبێت سەرنج بداتە ئەو سوودە زۆرانەی کە لەگەڵ پیربووندا دێت. — وە قبووڵکردن هەمیشە دۆخە ناپەسند و هەستە نەرێنییەکان ڕەت دەکاتەوە.

**تێبینی**: زاڵبوون بەسەر گێراسکۆفۆبیادا کات و سەبر و خۆڕاگریی دەوێت. لەبەر ئەوە، میهرەبان ببە لەگەڵ خۆت و ڕۆژانە هەنگاوی بچووک بنێ بەرەو بەڕێکردن و زاڵبوون

بەسـەر ترسـەکانتدا. — وە بـە سـتراتیژی و پشـتیوانییەکی تەندرووست، تاکێک دەتوانێت بەسـەر ئـەم ترسـەدا زاڵ بێت و جڵەوی خۆی لە ژیانێکدا ئەنجام بدات.

[١٣]

گەنجپەرستییەکانی ناو تەمەن: پەرستنی گەنجان، یان وەسوەسەی کولتووری بۆ گەنجییەت [٩] و ستایشکردنی گەنجییەتی و گەنج-پەرستی [Youth Worship] ... — بووەتە دیاردەیەکی باو لە کۆمەڵگا مۆدێرن و پاش-مۆدێرنەکاندا. — ئەم مەیلە بۆ بەهادان بە گەنجان لە سەرووی هەموو شتێکەوە لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەلتووری هاوچەرخدا ڕەنگ دەداتەوە. ئەم دیاردەیە پەرستنی گەنجان نییە بۆ هاریکاریکردن و یارمەتیدانیان. — نەخێر. بەڵکوو ئەم دیاردەیە جەخت لەسەر ئیستیغلالکردنی ئێستاتیکایی [Aesthetic Exploitation] [١٠] خودی گەنجییەت دەکاتەوە. لە مۆدە و ڕەوتی جوانکارییەوە هەتا دەگاتە میدیا و مۆدە کات-بەسەربردنەکان (شادیبەخشەکان/Entertainment). — لە کاتێکدا هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە ئاڵۆز و فرەلایەنە،

بــەڵام دەرئەنجامــەکانی پەرســتنی گــەنجان کاریگەرییــەکی بەرچاوی نەرێنی لەسەر تاک و کۆمەڵگاکاندا هەیە.

یــەکێک لــە لایەنــە هــەرە بــەرچاوەکانی گەنجپەرســتی، جەختکردنەوەیـــە لەســـەر ڕوخســـاری جەســـتەیی و ڕووکەشــگەرایی. — پیشەســازییەکانی جوانکــاری و مــۆدە بەتایبــەتی؛ بیرۆکــەی گــەنجی وەکــوو ســتانداردێکی ســەرنجڕاکێش دەخەنــە ڕوو. وە زۆرجــار هــانی کۆمــەڵگا دەدەن کە ڕێکاری جوانکاری جیاواز و مەترسیدار ئـەنجام بدەن و بەرهەمی جۆراوجۆر بەکاربهێنن بۆ ئەوەی بـەدوای دیمەنێکی گەنجتردا بگەڕێن و بەسەر خۆیـانی بسـەپێنن. — ئەم گرینگیدانە بە ڕواڵەتی جەستەیی لە جڤاکێکدا، دەتـوانێت کاریگـــەریی دەروونی قـــووڵی هـــەبێت لەســـەر تـــاک و کۆمەڵگایەک بە گشتی ... چونکە ڕەنگە تاکـەکان هەسـت بـە فشـــار بکـــەن بـــۆ ئـــەوەی لەگـــەڵ ســـتانداردێکی تەســک و

ناڕاستەقینەی جوانیدا خۆیان بگونجێنن. — ئەمەش دەبێتە هۆی نارازیبوونی تاک بەرامبەر بە جەستەکانیان و کەمبوونەوەی باوەڕبەخۆبوون و تەنانەت بەرجەستەبوونی کێشەی دەروونیش.

جگە لەوەش، دیاردەی گەنجپەرستی و بەرجەستەکردنی لە ڕێگەی میدیا و پانتاییە کۆمەڵایەتییەکان، دکرێت ببێتە هۆی دابەزینی بەهای تاکەکانی <بەتەمەن/پیر> لە کۆمەڵگاکاندا. — کە ئەمەش بەشدارە لە جەختکردنەوە و پەرەپێدانی تەمەنگەرایی و پەرستنی تەمەنێک[Agesim] [١١] — وە تەمەنپەرستی. جەختکردنەوەی بەها باوەکانی کەلتوورێکە لەسەر گەنجییەت. — ئەم نەخۆشییە زۆرجار پیربوون بە چەشن و بابەتە نەرێنییەکانەوە دەبەستێتەوە. — وەکوو: دابەزین و کەمبوونەوەی جوانی. و لاوازی جەستەیی و لاوازی ئەقڵ و هیدیکەش ... — لە ئەنجامدا بە ئەگەرێکی

زۆرەوە کەسانی بەساڵاچوو و بەتەمەن، ڕووبەڕووی وەدەرنانی کۆمەڵایەتی و جیاکاری کۆمەڵایەتی دەبنەوە لە شوێنی کار و چەندین پێگەی دیکەی کۆمەڵایەتی. — وە لەناو بازنە گشتییەکانی میدیا و گوتاری گشتیدا بوونیان کەم دەکرێتەوە و کپ دەکرێن. وە ئەمەش دەتوانێت هەستی بێ-سەرپەرشتیکردن و پەراوێزخستن بۆ تاکە بەتەمەنەکان دروست بکات و ببێتە هۆی هەستکردن بە گۆشەگیری و تەنیایی بۆیان. کە ناشێت ژیان بۆ کەسانی بەتەمەن ئاوا بێت ... وە دەبێت چارەسەر بکرێت و ئەم نەخۆشییە بە هەند وەربگیرێت.

هەروەها کاریگەریی گەنجپەرستی دەتوانێت لە دەروونناسی تاکەکەسی تێپەڕێت و بەشداری بکات لە پرسە کۆمەڵایەتییە فراوانەکاندا و ببێت بە دیاردەیەکی کۆمەڵناسانە. — بەرزبوونەوەی ڕێژەی ویستنی گەنجییەت

لەناو کۆمەڵگاکاندا، بێ-شک دەبێتە هۆی شکۆمەندکردنی نەزانین و بەرزڕاگرتنی کەم-مەعریفەت و ناپێگەیشتووییش ... چونکە تەمەنی گەنجییەت لە ئێستادا، لەناو نەزانییەکی قووڵدایە. — بەتایبەتی لە چوارچێوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی سەرهێڵ و کەلتووری دیجیتاڵیدا. — ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی دیارنەمانی <بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە> و <تێگەیشتنێکی قووڵ> لە پرسە ئاڵۆزەکاندا بۆ چینی گەنجی کۆمەڵگاکان. — کە دەبێتە هۆی جەمسەرگیریی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری. وە نەهێشتنی پەیوەندی لەگەڵ پرسە کۆمەڵایەتییە گرنگەکاندا.

یەکێکی دیکە لە کاریگەرییەکانی گەنجپەرستی لەسەر کۆمەڵگاکاندا، لە شوێنی کار و پیشەکاندا بەرچاوە و ڕوونە. — کە ئەو بەهایە بەرزەی لەبۆ تەمەنی گەنج داندراوە، بەشداری دەکات لە جیاکاری و تەمەنگەرایی و ڕێزنەگرتن

له ئەزموون و مەعریفەی بەتەمەنەکانی کۆمەڵگایەک. ڕەنگە کارمەندە بەتەمەنەکان بۆ هەلی کار بگوازرێنەوە و، وەرنەگیرێن ... وە ڕەنگە بەشدارییەکانیان کەم بکرێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕەزامەندی لە کار و پیشەی کۆمەڵگا و لەدەستدانی ورەی تاکەکان بە وڵاتەکەیان. — ئەم دیاردەیە بەتایبەتی لەو پیشەسازیانەدا کێشەدار دەبێت کە پشت بە کارامەیی و زانیاری تایبەتمەند دەبەستن. وەکوو: پزیشکی یان تەکنەلۆژیا، کە ئەزموون و شارەزایی زۆر پێویستترە لە تەمەنی گەنج، بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان و، لێرەدا دەبێت هەمیشە بەتەمەنێک سەرپەرشتی شوێنەکە بکات. چونکە پەیوەندی بە هەبوونی ئەزموونێکی زیاترەوە هەیە. — کەواتا؛ بێشک دەکرێت هەڵبژاردنی گەنج بۆ پیشە و کارە هەستیار و چارەنووس-سازەکان مەترسیدار بێت لەسەر کۆمەڵگایەکدا. — چونکە بە ڕێژەیەکی زۆر چینی گەنجەکان ئەزموونیان کەمترە لە

چینی بەتەمەنەکان [ئێمە لێرەدا باس لە گشت دەکەین بێ-شک تاک تاکە گەنج هەن کە زۆر لە بەتەمەنەکانیش داناتر و زیرەکترن ...]

گەنجپەرستی دیاردەیەکی کەلتووری و کۆمەڵایەتییە. وە کاریگەریی قووڵی لەسەر تاک و کۆمەڵگاکاندا دەرخستووە لە سەدەی بیست و یەکدا. جەختکردنەوە لەسەر گەنجی و <دەرکەوتنی جەستەیی/ڕووکەشگەرایی> دەتوانێت بەشدار بێت لە دەرئەنجامە دەروونییە نەرێنییەکان، وەکوو: <نارازیبوونی جەستەیی> و <کەمبوونەوەی ورە>. سەرەڕای ئەوەش، بە شکۆمەندکردنی گەنجییەت دەتوانێت ببێتە هۆی بەرپاکردنی بیرۆکەی تەمەنگەرایی و جیاکاری کۆمەڵایەتی لە جڤاکێکدا.

***

ئەگەرچی هۆکارەکانی دەرکەوتنی دیاردەی گەنجپەرستی زۆرن، بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بە کۆمەڵێکیان بکەین:

دیاردەی گەنجپەرستی نیشانەی [سیمپتۆم] کولتووورە مۆدێرنەکان و پاش-مۆدێرنەکانە. دەرکەوتنی ئەم دیاردەیە پابەندە بەم خاڵە سەرەکییانەی خوارەوە:

بیرکردنەوە باوەکان [ستێریۆتایپ] : ئەم جۆرە بیرکردنەوە باو و عادەتییانە سەبارەت بە پیربوون، هەڵوێست و مانابەخشینی نەرێنی لەبۆ کەسانی بەتەمەن دروست دەکەن. بۆ نموونە: ئەو بیروباوەڕەی کە کەسانی بەتەمەن کەمتر توانایان هەیە، کەمتر بەرهەمدارن، یان کەمتر بەهایان هەیە لە چاو کەسانی گەنجتر، دەبێتە هۆی دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ڕق و کینە لە چینی بەتەمەنەکان.

ترس لە پیربوون: بەشێکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵگاکان، لە دۆخی پیربوون دەترسن. ئەم ترسەش دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی تێڕوانینی نەرێنییانە بەرامبەر بە کەسانی بەساڵاچوو ... وە ئەم تێڕوانینە نەرێنییە لە کۆتاییدا دەکرێت بە پەیامێکی کۆمەڵایەتی. کە پیربوون لەگەڵ لاوازبوون و لەدەستدان یەکسان دەکرێتەوە.

وە هەروەها، هۆکاری ئابووریش هەن کە ئەم دیاردەیە زەقتر دەکەنەوە: لە زۆرێکی کۆمەڵگاکاندا، کەسانی بەساڵاچوو وەک بارگرانییەک لەسەر ئابووریی وڵات و ناوچەیەک، ڕەچاو دەکرێن. بەتایبەتی لەڕووی >چاودێریکردنی تەندرووستی< و >ئاسایشی کۆمەڵایەتی< ... ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی تەمەنگەرایی لە شوێنی کار و بوارەکانی دیکەی کۆمەڵگاکاندا.

هۆکارێکی دیکەی ڕق لە پیربوون، بریتییە لە تێنەگەیشتن: بەشێکی زۆری تاکەکان لە ئەزموونی کەسانی بەتەمەن تێناگەن و ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی هەڵوێستگرت و ڕەفتاری تەمەنگەراییانە. بۆ نموونە: ڕەنگە کەسانی گەنجتر قەدری ئەو تەحەددایانە نەزانن کە کەسانی بەساڵاچوو ڕووبەڕووی دەبنەوە لە ڕووی سنووردارکردنی جەستەیی و کێشە تەندروستییەکان و گۆشەگیربوونی کۆمەڵایەتی ...

هۆکارێکی دیکەی بەرچاو، بریتییە لە نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییە باوەکان: لە هەندێک کۆمەڵگادا گەنجان بەراورد بە پیرەکان، بەهایەکی زۆتریان پێدەدرێت و ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی بەرپابوونی هەڵوێستی تەمەنگەراییانە. بۆ نموونە: لە ڕیکلامەکاندا زۆرجار دەبیندرێت گەنجان و جوانی بە نرخ دەزانرێن و لە

<کەلتووری باو>دا کەسانی بەتەمەن بە ڕوانگەیەکی نەرێنی وێنا دەکرێن.

***

## چارەسەرەکانی گەنجپەرستی:

لێرەدا چەند ستراتیژییەک دەخەینەڕوو کە دەکرێت یارمەتیدەر بن بۆ کەمکردنەوە و بنبڕکردنی دیاردەکە:

**قبووڵکردنی پیربوون**: یەکێک لە ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی گەنجپەرستی و تەمەنگەرایی، بریتییە لە وەرگرتن و قبووڵکردنی پرۆسەی پیربوون و بەهادان بەو حیکمەت و ئەزموونانەی کە لەگەڵ تەمەنێکی گەورەدا دێن. ئەمەش دەکرێت بریتی بێت لە پێناسەکردنەوە و گۆڕینی

ستاندارده باوەکانی جوانی؛ بۆ ئەوەی چرچی و لۆچی و قژی خۆڵەمێشی لەخۆ بگرێت و رێز لەم تایبەتمەندییە جەستەییانە بگیرێت کە لە تەمەنی پیریدا تووشی تاکێک دەبن.. وە هەروەها هەستکردن بەو حیکمەتە مەزنەی کە لە تەمەنێکی گەورەدا تاکێک بەدەستی دەهێنێت سەبارەت بە ژیان و خودی خۆی و مرۆڤەکانی دەورووبەری.

**هاندانی فرەچەشنی [لە تەمەنەکاندا]** : زۆرجار شەپۆلی گەنجپەرستی، پێناسەیەکی تەسک و چەقبەستوو بۆ جوانی و سەرکەوتن دەکات. وە ئەو کەسانە بەدەر دەکات کە لەگەڵ قاڵبەکەدا ناگونجێن. هاندانی هەمەجۆریی بە هەموو فۆرمەکانییەوە، بە تەمەنیشەوە، دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە تەحەداکردنی ئەم پێناسە تەسکانە و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگایەکی گشتگیرتر و تێگەیشتوو و هۆشیارتر.

**پەرەپێدانی <خۆقبووڵکردن>:** ئەو کەسانەی گەنجییەت دەپەرستن زۆرجار ئەو کارە ئەنجام دەدەن چونکە هەست بە نائەمنی و نائارامی دەکەن سەبارەت بە پرۆسەی پیربوونی خۆیان. هاندانی خۆقبوڵکردن و خۆپاراستن، دەتوانێت یارمەتیدەر بێت لە بەرەنگاربوونەوەی ئەم هەستانە و بەرەوپێشبردنی هەڵوێستێکی ئەرێنیتر بەرامبەر بە پیربوون.

خاڵێکی دیکەی گرینگ بۆ چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە، بریتییە لە **پەروەردەکردنی گەنجان**: زۆرجار دیاردەی گەنجپەرستی لە تەمەنێکی گەنجیەوە دەست پێدەکات و بە هۆی پەیامە میدیایی و کولتوورییە باوەکانەوە، بەردەوام دەبێت و جڵەوی خۆی دەکات. پەروەردەکردنی گەنجان لەسەر کاریگەرییە نەرێنییەکانی گەنجپەرستی و پەرەپێدانی وێنەی ئەرێنی پیربوون لەلای گەنجەکان، یارمەتیدەر دەبێت

بـۆ ڕێگریکــردن لــە گەشــەکردنی هــەر بیرکردنەوەیــەکی تەمەنگەراییانە.

وە هەندێک جار ئەم دیاردەیە پێویستی بـە **چارەسـەرکردنی هۆکــارە کۆمەڵایەتییــەکان** دەبێت: زۆرجــار گەنجپەرســتی بەســتراوەتەوە بــە پرســە گــەورەکانی کۆمــەڵگاوە. وەکـوو: تەمەنگەرایی و ڕەگەزگـەرایی[مێ/نـێر] ... چارەسـەرکردنی ئــەم هۆکــارە بنەڕەتیانــە لــە ڕێگــەی گۆڕانکارییــەکانی بـارودۆخی ڕامیـاری و گۆڕانکارییـە کولتوورییـە باوەکـان، دەتـوانێت یارمەتیـدەر بێت لـە درووسـتکردنی کۆمەڵگایـەکی دادپەروەرانــەتر و تێگەیشــتووتر لــە پــای چین و تــوێژی تەمەنەکاندا.

بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە پێویستی بە تێکەڵەیـەک لـە **<گۆڕانکــاری تاکەکەســی> و <گۆڕانکــاری کۆمەڵایــەتی>**

هەیـە. بـە بـەهادان بـەو حیکمـەت و ئەزموونـەی کـە لەگـەڵ تەمەنــدا دێن، پێشخســتنی هەمــەجۆریی و خۆقبــوڵکردن، پــەروەردەکردنی گــەنجان، و چارەســەرکردنی هۆکــارە بنەڕەتییــە کۆمەڵایەتییــەکان، وا دەکــات بتــوانین جڵــەو و جووڵە بکەین بـەرەو کـەلتوورێک کـە بـەهای مرۆڤـەکان لـە هــەموو تەمــەن و پاشــخانێکدا بــە هەنــد وەردەگــرێت و جیاکاری لە نێوانیاندا ناکات.

[١٤]

خاڵێکی دیکە لە پرسی گۆشەگیربوون و نامۆییبوونی چیـنی تەمەنەکاندا، بریتییە لە: جیاکردنـەوەی تەمەنـەکان. [١٢] ئـەم دەستەواژەیە ئاماژەیە بۆ کرداری جیاکردنەوەی تاکەکان بە پشتبەسـتن بـە تەمـەنیان. — لـە زۆرێـک لـە کۆمەڵگاکانـدا جیاکردنەوەی تەمەن وەک بەشـێکی سروشـتی ژیـان سـەیر دەکرێت، کە گروپە تەمەنییە جیاوازەکان لە کایەی جیـاوازدا

دەژین و کاردەکــەن و پرســە کۆمەڵایەتییــەکان و ژیــانی ڕۆژانەیان بەسەر دەبەن لـەم سیاقەوە. ئەگـەرچی دیـاردەی جیاکردنــەوەی تەمــەن دەکـرێت هەنـدێک سـوودی گشـتی هــەبێت، وەکــوو ڕێگــەدان بــە تاکــەکان بـۆ پەیوەنــدی کۆمەڵایەتی لەگەڵ هاوتەمەنەکانیان کە ئـەزموون و دیـدگای هاوشـێوەیان هەیـە ... بـەڵام لـە هــەمان کاتـدا دەکـرێت دەرئەنجامی نەرێنیشی هەبێت.

یــەکێک لــە دەرئەنجامــە نەرێنییــە هــەرە مەترسـیدارەکانی جیاکردنەوەی تەمەنـەکان، ئەوەیـە کـە دەتـوانێت ببێتـە هـۆی تەمەنگەرایی، یان جیاکاری لە دژی تاکەکان بەپێی تەمەنیان. تەمەنگـەرایی دەتـوانێت چەنـدین شـێوە بگرێتـە بـەر، لەوانـە: گریمانەکردن و گومانکردن سەبارەت بە تواناکانی تەمـەنێک و سـنووردارکردنی تـاکی بەتەمـەن. تەمەنگـەرایی دەتـوانێت کاریگەرییـەکی بـەرچاوی لەســەر تەندروسـتی دەروونی و

جەستەیی تاکەکان هەبێت.

جگە لەوەش جیاکردنەوەی تەمەن دەتوانێت ببێتە هۆی پارچە-پارچەبوونی کۆمەڵگاکان، تاکەکانی تەمەنی جیاواز لە بلۆکی جیاوازدا دەژین و کار دەکەن. ئەم پارچەبوونە دەکرێت زەحمەت بێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگاکان کۆ ببنەوە بۆ چارەسەرکردنی ئاستەنگە هاوبەشەکان و بنیاتنانی ناسنامە و بەها هاوبەشەکانیان. هەروەها دەتوانێت دەرفەتەکانی توانستی ڕاهێنەرایەتی و گواستنەوەی زانیاری و لێهاتووییەکان بۆ نەوە گەنجەکان سنووردار بکات.

جیاکردنەوەی تەمەن بە درێژایی مێژوو چالاکییەکی باوی کۆمەڵگاکان بووە. کۆمەڵگا و کولتوورە جیاوازەکان فۆرم و شێوازی تایبەت بە خۆیان هەبووە لەسەر ئەم دیاردەیەدا.



لەگـەڵ سـەرهەڵدانی پیشەسـازی لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا، جیاکـاریکردن لـە تەمەنەکانـدا زیـاتر دەرکـەوت و لەگـەڵ سـەرهەڵدانی فـۆڕمی نـوێی کـار و دەرکـەوتنی دامـەزراوە گشتگیرەکانی پەروەردە ... — وای کرد کـە منداڵان زیـاتر بنێردرێن لەبۆ قوتابخانـەکان و، هـەوڵی فێربوونی کارامـەیی و بـەها سـەرەتاییەکان بـدەن. — لـە کاتێکدا گـەورەکان لـە

کارگە و شوێنە پیشەسازییەکانی دیکەدا کاریان دەکرد و ئیشکردنی بە کۆمەڵ بەربڵاو بوو و لە ئاستێکی بەرزدا بوو. لە لایەکی دیکەوە بەساڵاچووان زۆرجار لە هێزی کار و پیشەسازییەکان دوور دەخرانەوە و بەجێ دەهێڵدران بۆ ئەوەی لەناو سووچی خانەنشینی بن، یان لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکانیان بژین.

لێرەدا پێویستە بەشێک لە **کاریگەرییە نەرێنییەکانی جیاکاری تەمەنی** ئاشنای خوێنەر بکەین:

**تەمەنگەرایی**: جیاکردنەوەی تەمەن دەتوانێت ببێتە هۆی دروستبوونی چەشنی کۆنەپەرستانە و هەڵوێستی نەرێنی بەرامبەر بە هەندێک گرووپی تەمەن. — ئەمەش دەتوانێت ببێتە هۆی هەڵوەراندن و ڕەخنەگرتن بەرامبەر بە تاکی بەتەمەن یان گەنجتر، کە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی

دەرفەتــە کۆمەڵایەتییــەکان و دوورخســتنەوە و دابــڕانی کۆمەڵایەتی.

**نـەبوونی دەرفـەتی کـارلێکی نێوان نـەوەکان**: جیاکردنـەوەی تەمـەن دەتـوانێت دەرفەتـەکان بۆ تاکـەکانی تەمـەنی جیـاواز سنووردار بکات بۆ کارلێککردن و فێربوون لـە یـەکتری. — ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی تێگەیشـتن و هاوسـۆزی و ڕێزگـرتن لـە سەرانسـەری گرووپـە تەمەنییـەکان. ئەمـەش دەســتی دەبێت لــە پارچــە-پارچــەبوونی کۆمەڵایــەتی و ڕێگریکردن لـە گەشـەکردنی بـەها و ناسـنامە هاوبەشـەکانی جڤاکەکان.

**دەرفەتی سنووردار**: جیاکردنەوەی تەمەن دەتـوانێت ڕێگـری بکات لە گواستنەوەی مەعریفـەت و لێهـاتوویی و ئـەزموونی ژیانێـک بـۆ نـەوە گەنجـەکان. ئەمـەش دەتـوانێت ببێتـە هـۆی

لەدەستدانی تێڕوانین و لێهاتووییە بەنرخەکان. کە ڕەنگە ئەمەش ژیان بۆ تاکە گەنجەکان قورستر بکات بە هۆی کارلێکنەکردنیان لەگەڵ تەمەنی جیاوازدا.

**کۆمەڵگە پارچەپارچەبووەکان**: جیاکردنەوەی تەمەن دەبێتە هۆی لێکترازانی تەمەنەکان لە کۆمەڵگایەدا. وە تەمەنەکان ناتوانن لەگەڵ یەکتریدا بن. ئەمەش وا دەکات کە زەحمەت بێت کۆمەڵگاکان کۆببنەوە بۆ چارەسەرکردنی ئاستەنگە هاوبەشەکان و بنیاتنانی ناسنامە و بەها هاوبەشەکان. بەڵکوو کۆمەڵگاکان تەنها لەناو گرووپی تەمەنی خۆیاندا دەمێننەوە و، هیچ هەوڵدانێک بەدی ناکرێت.

خاڵێکی نەرێنی دیکە لە جیاکردنەوەی تەمەنەکاندا، بریتییە لە **کەمبوونەوەی بەشداری کۆمەڵایەتی**: جیاکردنەوەی تەمەن دەتوانێت ببێتە هۆی کەمبوونەوەی بەشداریکردن لە

چالاکییە کۆمەڵایەتی و مەدەنییەکان، بەتایبەتی بۆ کەسانی بەتەمەن کە ڕەنگە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و سەرچاوە کۆمەڵایەتییەکان دابڕاو بن. ئەمەش دەکرێت ببێتە هۆی کەمبوونەوەی خۆشگوزەرانی و کەمبوونەوەی ڕێژەی تەندرووستی کۆمەڵگایەک.

***

**چارەسەرەکان:**

لێرەدا چەند خاڵێک دەخەینەڕوو بۆ چۆنیەتی کەمکردنەوەی جیاکاریی تەمەنەکان:

**پەرەپێدانی کارلێکی نێوان نەوەکان و چینی تەمەنەکان :**

هاندانی کارلێک و هاوکاری لە نێوان تاکەکانی تەمەنی جیاواز هەنگاوێکی بنەڕەتییە بۆ کەمکردنەوەی ئەم

دیاردەیـــە. ئـــەم ئامانجـــە دەکـــرێت لـــە ڕێگـــای بەرنامـــە کۆمەڵایەتییـــەکان و بۆنـــە کۆمەڵایەتییـــەکان و دەرفەتـــە کۆمەڵایەتییـــەکان بەدەســـت بهێنـــدرێت. کـــە تیایـــدا گروپـــە تەمەنییە جیاوازەکان کۆ دەبنـەوە بۆ فـێربوون لـە یـەکتر و پشتگیریکردن لە یەکتر.

**پێشخستن و گرینگیدان بە دیزاینی گشتگیر**: دیزاینکردن و بونیادنـــانی شـــوێنە گشـــتیەکان و بیناکـــان و سیســـتەمی گواســتنەوەکان، کــە تیایــدا تاکــەکان لــە هــەموو تەمــەن و تواناکاندا دەسـتیان پێ دەگـات، دەکـرێت یارمەتیـدەر بێت لـە کەمکردنــەوەی جیاکــاریی تەمــەنی لــە ڕێگــەی ئاســانکردنی کــارلێککردن و جوولــەی خــەڵک بــۆ کۆمــەڵگاکانیان. لـێرەدا پێویسـتە شـوێنە گشـتییەکان وەهـا دیـزاین بکـرێن کـە لـەبۆ هەموو چین و توێژێکی تەمەنێک، گونجاو بێت.

**بەرەنگاربوونـەوەی تەمەنگـەرایی**: چارەسـەرکردنی چەشـنە باوە نەرێنییـەکان و لایەنگیرییـەکان بەرامبـەر بـە تاکـەکانی بەتەمـــەن یـــان گـــەنجتر، دەتـــوانێت یارمەتیـــدەر بێت لـــە کەمکردنـــەوەی جیاکـــاریی تەمـــەنی و بەرەوپێشـــبردنی کۆمەڵگەیـــەکی تێگەیشـــتووتر و هۆشـــیارتر. ئـــەم پرســـە دەکـرێت هەڵمەتـەکانی پـەروەردەی گشـتی، ڕاهێنـان بـۆ دابینکـەرانی چـاودێری تەندرووسـتی و یاسـایەک کـە لـە جیاکاری تەمەن تاک دەپارێزێت لەخۆبگرێت.

خـاڵێکی دیکـە سـەبارەت بـە تەمـەن لـە ئێسـتادا، بریتییـە لـە گـوێ-نـەدان بـە چیـنی گەنجانـەکان لـە ئاسـتێکی ژیانەکیـدا. بێشـک گەنجـەکان لـە ڕووی ئێسـتاتیکاییەوە گرینگییـان پێ دراوە. بـەڵام لـە ڕوانگـەی چارەسـەرکردنی ئـەوان؛ نـەخێر. هەر وەک ئاشکرایە کە چینی گەنجی کۆمەڵگایەک داهاتووی هـەمان ئـەو کۆمەڵگایـەن ... کـەواتا پێویسـتە گرینگییـان پێ بدرێت. لە ئێستادا و لە سەردەمەکەماندا، ئەم گرینگی پێدانـە و نـاز هەڵگرتنـە ڕووی لـە کەمبوونەوەیە. گەنجـەکان بێهیـوا بـوون بەرامبـەر بـە نـەوەی ڕابـردوو و بەتەمەنـەکان. لـە دەقەکانی پێشتر گرینگییەکی زۆرم خستە سەر بەتەمەنەکان و ئەوانەی لە سەروو گەنجـەکانن. بـەڵام لـەم دەقـەدا، هـەوڵ دەدەم تیشک بخەمە سەر چینی گەنجان.

لـێرەدا پێویسـتە بەتەمەنـەکان ئـەم چالاکییانـە بـە ئـەنجام

بگەیەنن بۆ هاریکاریکردن و یارمەتیدانی گەنجەکان. کە پێویستە:

بەتەمەنەکان دەبێت وەکوو ڕاهێنەرێک خزمەت بکەن: ئەگەر زانیاری و ئەزموونت هەبێت لە بوارێک یان کارامەیییەکی دیاریکراودا، دەتوانیت ئەو زانیارییە لەگەڵ گەنجێکدا هاوبەش بکەیت بە بوون بە ڕاهێنەرێک یان فێرکارێک. بەشێکی زۆر لە ڕێکخراوەکان بەرنامەی ڕاهێنەرایەتی پێشکەش دەکەن کە تیایدا بەتەمەنێک دەتوانێت بەشدار بێت. یان دەکرێت خۆبەخشانە ڕاهێنەرایەتی چینی گەنجەکان لە کۆمەڵگادا بکات.

پێویستە هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی سەبارەت بە چینی گەنجەکان بوونی هەبێت لەلای بەتەمەنەکان. دەبێت ئەوان بزانن کە گەنجەکان لەناو چیدان و پاڵپشتییان بکەن لەبۆ چارەسەرکردن و باشترکردنی دۆخەکەیان.

## [تێزی کۆتایی]

چینی تەمەنەکان لە ئێستادا لە هەموو کات و سەردەمێکی دیکە لەیەکتری دابڕاون و پەیوەندییان بە یەکترییەوە نەماوە. گیانێکی هاریکاریکردن پێویستە خۆی دەربخاتەوە لە ئێستادا. دەبێت بە قووڵی ئاگامەند بینەوە بەوەی کە بێشک کردارەکانمان بە جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەریی خۆیان دەچەسپێنن لەسەر چینی تەمەنێکی دیکەدا. بۆوێنە: هەڵەی پیرەکان کاریگەریی بەرچاوی دەبێت لەسەر گەنجەکاندا. وە بە پێچەوانەشەوە، هەڵەی گەنجەکان کاریگەریی دەبێت لەسەر پیرەکان. پێویستە لە ئێستادا هۆشیار بینەوە کە کۆمەڵگا چۆن کار دەکات. کۆمەڵگا خاوەنی پەیڕەوێکی تەمەنکارانەیە. تەمەنەکان لەسەریانە هاریکاری یەکتری بکەن ئەگەرنا تەواوی پەیڕەوی کۆمەڵگا دەشڵەژێت. بەتایبەتتر هەروەک ئەوەی لە ئێستادا بەرچاوە کە سەرنجێکی زۆر لەسەر ئەو بابەتانەیە کە گەنجانەن لە

ڕووی ئێستاتیکاییەوە> نەوەکوو ئەو بابەتانەی کە <گـەنج-پەیوەسـت و گـەنج-پێویسـتن> ... پێویسـتە کۆمـەڵگاکان تەمەنەکانیان لە خزمـەتی تەمەنـەکانی دیکـەدا بێت. نـەوەکوو خۆیی بێت.

پێویستە ڕێز لە هەموو سوورڕێکی ژیان بگیرێت.

- وتە

## دوا وته

لــــه کۆتاییـــــدا، پرســـــی گۆشـــــەگفیربوونی تەمەنـــــەکان دمانگەڕێنێتەوە سەر پرسـیارکردن و گومـانکردن لـە خـودی ئەو سیستەم و مۆدێلانەی کە کۆمەڵگایـەک و جڤاکێک لـەبۆ تەمەنی دادەنێت.

وە ئـەم پرسـە پێمـان ڕادەگەیـەنێت کـە نـەخێر؛ سیسـتەمی ئێسـتا، مـۆدێلێکی گونجـاو نییـە لـەبۆ پـۆلێنکردنی تەمەنـەکان بەپێی سرووشتی خۆیان و داهاتوویـان. بـەڵکوو لـە ئێسـتادا تەمەنـەکان هـەموو شـکاونەتەوە بەسـەر یەکتریـدا. وە ئـەم دیاردەیەش جۆرەها نەخۆشی دەروونی بەرپا کردووە.

فەلسەفە لەناو تەمەنەکانـدا پرسـی پیربوون و گـەنجبوون و ڕەهەندە جیاکارییەکان دەخاتە ڕوو. وە پێمـان دەڵێت کـە لـە

ئێستادا ئێمە لەناو قەیرانێکی تەمەنگەراییانەداین. کە تیایدا چینەکان تەمەن، چیدیکە پابەند نین بەو پەیڕەوە سرووشتی و مرۆییەی کە وەها داندرابوو و باو بوو.

وە پرسی تەمەنەکان بابەتێکە پێویستە ڕەچاو بکرێت لەناو بازنە کۆمەڵایەتی و ئەکادیمی و زانستییەکاندا، وە پێویستە هەوڵ بدرێت بۆ ڕێکخستنەوەی تەمەنەکان و بەرپرسیارییەتەکانیان لە جڤاک و کۆمەڵەیەکدا.

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم لەم تێزە بچووکەدا ئەوە بگەیەنێم کە مەبەستمە. — وە هیوادارم خوێنەرانم بە گۆشەنیگایەکی ڕەخنەگرانەوە ڕەچاوی بابەتەکە بکەن و زیاتر هەوڵی زانینی لەبۆ بدەن.

پیری باغێکە لە حیکمەت. گەنجیش باغێکە بۆ

حیکمەت.

- وتە

سەرچاوە و پەڕاوێزەکان:

[1] Simone de Beauvoir – The Coming of Age – Translated by: Patrick O'Brian – 1996 – New York: W.W. Norton.

[2] Ibid.

[3] Ibid.

[4] Ibid.

[5] Ibid.

[6] Ibid.

[7] Ibid.

[٨] گێراسکۆفۆبیا/ترسی پیربوون – [Gerascophobia]:



ترســـێکی زیـــادەڕۆ و ناعەقڵانییـــە لـــە پـــیربوون یـــان گەورەبوون. وە جۆرێکی دیاریکراوی فۆبیایە کە دەتوانێت ببێتــە هــۆی ناڕەحەتییــەکی بــەرچاو و کاریگــەری لەســەر ژیانی ڕۆژانەی کەسەکە هـەبێت. ئـەو کەسـانەی کـە فۆبیـای جیراســکۆفۆبیایان هەیــە، لەوانەیــە تووشــی دڵــەڕاوکێ و خەمۆکی و نیشانەکانی دیکەی هاوپەیوەست بن.

وەک: ئارەقکردنەوە، لـەرزین، لێدانی خـێرای دڵ و تـرس و

دڵەڕاوکێیی ...  کاتێک ئەم تاکانە بیر لە پیربوون دەکەنەوە یان نیشانەکانی پیربوون لە خۆیان یان کەسانی دیکەدا دەبینن تووشی قەلەقی و خەمۆکی دەبن.

هەروەها ترس لە پیربوون لەوانەیە ببێتە هۆی دەرکەوتنی ڕەفتارەکانی دوورکەوتنەوە.

وەکوو: دوورکەوتنەوە لە بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکان یان چالاکییەکان کە پەیوەندییان بە پیربوونەوە هەیە ...

[٩] گەنج-پەرستی [Youth Worship] :



لــە ســەردەمی هاوچەرخــدا بــەهۆی ســەرهەڵدانی میــدیا و ڕیکلامــەوە پەرســتنی گــەنجان زیــاتر بــاو بــووە، ئەمــەش بەردەوام ئەو بیرۆکەیە بەهێزتر دەکات کە گەنجی و جوانی کلیلی سەرکەوتن و بەختەوەری و بەدیهێنانن.

ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە کولتوورێک درووست بێت کە گەنجان لە ئەزموون و حیکمەتدا بەهادار بن و بایەخێکی

زۆر لەسەر ڕوخساری جەستەیی دابندرێت. لە ئەنجامدا زۆر کەس بە تایبەتی ڕەگەزی مێ هەست بە فشار دەکەن بۆ پاراستنی شێوەی گەنجی خۆیان لە ڕێگەی ڕێکارەکانی جوانکاری و ئامرازەکانی ترەوە، ئەمەش سووڕی پەرستنی گەنجان بەردەوام دەکات و کۆمەڵگاکە زیاتر بەرەو دۆخێکی نەرێنی دەبات کە تیایدا ڕێز لە تەمەنی پیری ناگیرێت.

بە گشتی چەمکی پەرستنی گەنجان ڕەنگدانەوەی بەها و باوەڕە قووڵە چەسپاوەکانی کۆمەڵگاکەمانە سەبارەت بە جوانی و کامڵبوون و سەرکەوتن.

[١٠] ئیستیغلالکردنی ئێستاتیکایی – [Aesthetic Exploitation]:



ئیســـتغلالکردنی جوانیناســـییانە یـــاخود ئیســـتیغلالکردنی سەرنجڕاکێشـــییەت [ Attractiveness Exploitation] ئاماژەیـە بـۆ کـردەی بـەکارهێنانی هێمـا کولتوورییـەکان و بـەهاکانی جوانیناسـی، یـان زانینی نـەریتی کۆمـەڵێک کـەس بـەبێ ڕەزامەنـدی یـان دانپێـدانانی درووسـت. وە پاشـان

جوانی ئەم تاکانە بەکار دەهێندرێت بۆ ئەو مەبەستەی کە تاکێکی دیکە دەیەوێت.

ئەم پراکتیزەیە کاتێک ڕوودەدات کە ئەندامانی کولتوورێکی باڵادەست، جوانیناسیی کولتوورێکی پەراوێزخراو بۆ مەبەستی خۆیان، وەکوو مۆدەیەک یان هونەرێک دەگرنەبەر. وە بەبێ ئەوەی ڕێز و بەها بدەنە سەرچاوەگرەکان یان لە گرنگی ئەو کولتوورەی کە سەر بە خۆیان نییە تێبگەن.

ئیستغلالکردنی جوانیناسییانە دەتوانێت بە شێوەی جۆراوجۆر ڕوو بدات، وەکوو: بەکارهێنانی ئامڕازەکانی جوانی بۆ بازرگانیکردن پێیان و بەدەستهێنانی هێما ئابوورییەکان.

یاخود بەکارهێنانی ئامڕازەکانی جوانی بۆ بەدەستهێنانی سەرنجی مرۆڤێک یان کۆمەڵێک تاک و گرووپێک.

[١١] تەمەنگەرایی - [Ageism] :



تەمەنگەرایی جۆرێکە لە هەڵاواردن کە ڕەخنە یان لایەنگری لە مرۆڤەکان دەکات بە پێی پۆلێنبەندی تەمەنیان.

ئـەو بیروڕایەیـە کـە دەبێت چیـنێکی تەمـەن هـەر لـەناو چینەکەی خۆیدا بمێنێتەوە و ناکرێت ئەم تەمەنە لـەم چینـەدا هیچ داهێنانێک یاخود هـەوڵێک بدات. بۆنموونـە: منداڵ هـەر منداڵە و ناکرێت ببێتە مامۆستا یاخود پیشەیەکی دیکە.

ئەم دەرکەوتە و چەنـدین دەرکەوتـەی هاوشـێوە، بریـتین لـە ئاماژەی تەمەنگەراییانە لە کۆمەڵگا و جڤاکێکدا.

[١٢] جیاکردنەوەی تەمەنەکان - [Age Segregation] :



جیاکردنـــەوەی تەمەنـــەکان؛ ئاماژەیـــە بـــۆ جیاکردنـــەوەی جەســـتەیی و کۆمەڵایـــەتی و کولتـــووری تاکـــەکان بـــە پشتبەستن بە تەمەنەکانیان.

وە کاتێک ڕوودەدات  کەسانی گروپە تەمەنییە جیاوازەکـان لەیـەکتر جیـا بکرێنـەوە و دەرفـەتی کارلێککردنیـان لەگـەڵ یەکتردا سنووردار بکرێت.

جیاکردنەوەی تەمەن دەتوانێت لە چەندین شوێن و بۆشـایی جیاوازدا ڕوو بدات، وەکوو: قوتابخانە، گەڕەک، شوێنی کـار و چالاکییـە وەرزشـییەکان ... ئەمانـە و چەنـدین پیشـە و پێگەی دیکە؛ نموونەی جیاکردنەوەی تەمەن.

داناترینەکان زیاتر بێزارن بە لەدەستدانی کات.

- دانتێ ئەلیگییێری (Dante Alighieri)

